بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَسْتَهْدِية وَنعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، أَرْسَلَ اللهُ بِالْهُدَى وَدِين الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيدًا ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ [١]، يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَ اتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا [٢]، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْلَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَفَوْزًا عَظِيمًا [٣].

أَمَّا بَعْدُ[1]

فإنَّ أصدق الحديث كلامُ الله، وخيرَ الهدي هديُ محمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلَّم، وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ[٤].

ثمُّ أمَّا بَعْدُ،اللَهُمَ الطَّهِر قُلُبَنَا مِنَ الشُّبُهَاتِ وَالشَّهَوَاتْ وَأَعْمَالَنَا مِنَ الرِّياءْ.موسڵمانانی بەڕێز و سەنگین خۆشحاڵ و بەختەوەرین کە دووبارە پێتان دەگەینەوە بۆ پێشکەش کردنی باس و بابەتێکی شەرعی کە ویستمان لەپێناو خودای

---

[١] سورة ال عمران – اية ١٠٢.

[٢] سورة النساء – آية ١.

[٣] سورة الاحزاب – آيتين ٧٠ و ٧١.

[٤] صحيح المسلم (٨٦٧)





گەورە ئێوەی لێ ئاگادار بکەینەوە کە زەکاتی فطرە کە بەکوردی پێی دەگووترێ سەر فیترە یان زەکاتی سەر چاکردنەوە ، بەڕێزان و خۆشەویستان لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەو باس و بابەتە بە جوانی و ڕێک وپێکی باسی لێوە کراوە و ڕوونکردنەوەی لەسەر دراوە ، ئێمەش بە پشتیوانی خودای پەروەردگار پێناسەی دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە ئایا بۆچی ئەو زەکاتە دانداروە و وە ئایا ئەو زەکاتە دەکەوێتە سەر کێ و لە چی زەکاتەکە دەکەویتن و وە ئایا چی بدرێت باشە.

## زكاة الفطر و واجبیەتی :

خۆشەویستان ابن قدامەی مقدسی (رحمه الله) دەفەرمووێت : [ **وأُضِيفَتْ هذه الزَّكَاةُ إلى الفِطْرِ لأنَّها تَجِبُ بالفِطْرِ من رمضانَ.** ] [١] واتە : وشەی فیطر ئیزافە و زیادکراوەتە پاڵ وشەی زەکات چونکە لەکاتی بەربانگ کردنەوە (ڕۆژوو شکاندنی) ڕەمەزان دێتن (مەبەستی پێ ئەوەیە لە شەوی کۆتای ڕەمەزان کە فتار دەکرێتەوە و ڕۆژوو دەشکێندرێت پاشانەکە زەکاتەکە دەدرێت لەبەر هەندێیە ناوی لێندراوە زكاة الفطر واتە زەکاتی ڕۆژوو شکاندن و بەربانگ کردنەوە ) پاشانە ئیبن قوتەیبە (رحمه الله) دەفەرمووێت : [ **وقِيلَ لها فِطْرَةٌ لأنَّ الفِطْرَةَ الخِلْقَةُ** ] [٢] واتە : بۆیە پێی دەڵێن فیطر لەبەر فیطرەت و سرووشتی مرۆڤەکانە ، وەک خودای گەورە (ﷻ) دەفەرمووێت :﴿ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ ﴿٣٠﴾ ﴾ [٣] واتە : فیترەت و بەرنامەی خوایە کە لە ناخی خەڵکاندا چاندویەتی ، وە لەپاشان زەکات دان لە ساڵی دووەمی هیجری لەگەڵ ڕۆژووی

---

[١] المغنی لابن القدامة جلد (٣) صفحة (٥٥).

[٢] المغنی لابن القدامة جلد (٣) صفحة (٥٥).

[٣] سورة الروم – آية ٣٠.





مانگی ڕەمەزان واجب و پێویست کرا لەسەر مووسڵمانان وەک عبداللهی کوڕی عومەر(رضی الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموویت : « فَرَضَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم صَدَقَةَ الْفِطْرِ.أَوْ قَالَ رَمَضَانَ.عَلَى الذَّكَرِوَالأُنْثَى، وَالْحُرِّوَالْمَمْلُوكِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍأَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ عَلَى الصَّغِيرِوَالْكَبِيرِ» [1] واتە : پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) زەکاتی سەرفیترە و (سەرچاکردنەوەی) پێویست کرد یان فەرمووی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی لەخودایەوە بۆ ئێمە هێنا کە تییایدا بەڕۆژوو بین لەسەر نێرینەکان و مێیینەکان وە ئەوانەی کۆیلەن و ئەوانەشی سەربەست و ئازادن یەک صاع (ڕبە) لە قەسپ و لە خورمای یان یەک ڕبە لە (جۆ)ی خەڵکەکەش کردیانە نیو صاع (ڕبە) لە گەنمی وە لەسەر بچووک (منداڵ) و گەورەی پێویست کرا کە زەکاتی سەرفیترە بۆ بدرێ و بیداتن. وە لە لفض و گێڕانەوەیەکی تردا وتراوە : « أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ »[2] واتە : ئەو زەکاتە دەبێ ئەو کاتە بدرێ پێش ئەوەی خەڵک بچنە (نوێژی جەژن) ، جا ڕای جمهوور و زۆرینەی زانایان دەڵێن واجبە و پێویستە لەسەر هەر تاکێکی مووسڵمان جا گەورە بێ یا بچووک سەرفیترەی بداتن و سەری چاک بکاتەوە لەمانگی ڕەمەزان وەک ابن المنذر ئیجماعی لەسەر گواستیتەوە و دەفەرمووێت : [ وأجمعوا على أن صدقة الفطر فرض ] [3] واتە : ئیجماع و کۆدەنگی لەسەر ئەوەی بووە کەوا زەکاتی سەرفیترە (سەر چاکردنەوە) واجب و پێویستە ، وە پێشەوا بەیهەقیش هەروەکو ئیمامی نەوەوی لە المجموع لێی دەگێڕیتەوە و دەفەرمووێت : [ وَقَدْ أَجْمَعَ

---

[1] صحيح البخارى (١٥١١) ومسلم (٩٨٤)باختلاف يسير، والنسائى (٢٥٠٠) والترمذي (٦٧٥).

[2] صحيح البخارى (١٥٠٣) ومسلم (٩٨٦).

[3] الاجماع لابن المنذر صفحة (٥٥).





**الْعُلَمَاءُ عَلَى وُجُوبِ صَدَقَةِ الْفِطْرِ]** [١] واتە : بێگوومان زانایان کۆدەنگ بوونە لەسەر واجبێتی و پێویستیەتی و فەڕزی زەکاتی سەر فیترە و (سەر چاکردنەوە) ، جا دەڵێن بەڵگەکەشی ئەوەی کە خودای پەروەردگار لە سوورەتی ئەلئەعلادا دەفەرموویت : ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ ﴾ [٢] واتە : بەڕاستی و بێگوومان سەرفراز بوو ئەو کەسەی کەوا زەکاتی داو خۆی پاک کردەوە و وە ئەو کەسەی کەوا زیکر و یادی خودای دەکاتن و ناوی خودای دەینیت ( وە نوێژ دەکات و سوجدە و کڕنۆش بۆ خودای گەورە دەبات ) ، جا هەندێ لە زانایاندا ئەو ئایاتانەیان وا تەفسیر کردووە کە دەڵێن ئەو دوو ئایەتە خودای گەورە (ﷻ) مەبەستی پێ زەکاتی سەرفیترەیە وە مەبەستیشی پێ واجب کردنە و فەرمانی داوە بە بەندەکانی ،ڕاو بۆچوونی دووەم کە زانایانی مالکی و ئیبنو لیبان لە زانایانی شافعی وە هەندێک لە زانایانی مەذهەب و ڕێڕەوی ضاهری کە هەندێک دەڵێن ابن حزم هەمان ڕاو بۆچوونی هەیە کە ئیمامی مالک ئەو قسەیەی کردووە بەڵام هەندێکی تر دەڵێن وانیە گرینگ ئەوەیە کەواتە ئەگەر یەک دووانێکیش بن هەندێک لە زانایان ڕاو بۆچوونیان وابووە کە دەڵێن : زەکاتی سەرفیترە تەنها سووننەتێکی پێلەسەرداگری (مؤكد)ەیە ، بەڵام ئەو ڕاو بۆچوونەیان لاوازە و ئیشی پێ ناکرێتن ئەوەی تریان (واجبێتی)تەواوە و بەڵگەی لەسەرە.

---

[١] المجموع للنووی جلد (٦) صفحة (٦٦).

[٢] سورة الأعلى – آيتين (١٤ و ١٥).

## حیکمەتی زەکاتی سەرفیترە دان :

ئیبنو عەباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە و دەفەرمووێت : « فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ » [1] واتە : پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) زەکاتی سەرفتیرەی واجب و پێویست کرد لەسەر موسڵمانەکان و فەرمووی ئەوە پاکبوونەوەیە  بۆ ئەوانەی ڕۆژووەوانن و ڕۆژوو دەگرن لە قسەی هەڵیت و پەڵیت و بێمانا یان هەڵە و کەم و کورتیەیەکی تر کەوا دەیکەن (لە کاتی بەڕۆژووبووندا بۆیان پڕ دەکاتەوە) ، لەبەر هەندێیە زانایان دەفەرموون (طرفع خلل الصيام) واتە : بەهۆی زەکاتی سەرفیترەوە ئەو کەم و کوورتیانەی کاتی ڕۆژووگرتنت کەوا گرتیت هەتبووە بۆت پڕ دەکاتەوە جا هەموو عیبادەتێک و پەرستشێک وایە زانایان دەفەرموون  سووننەتی ئەوەی بۆ داندراوە تا کەم وکورتیەکانت بۆ پڕ بکاتەوە (والله اعلم).

## زكاة الفطر لەسەر كێ واجبە؟

زانایان دەفەرموون زەکاتی سەرفیترە لەسەر هەموو موسڵمانێکی واجبە جا موسڵمانەکە بەتەمەن بێ یان بچووک بێت تەنانەت ئەو کۆرپەلەی ڕەحیمی دایکی ئەگەر لەپێش نوێژی جەژن لە دایک ببێت بە چەند چرکە ساتێکیش ئەوا زەکاتی سەرفیترە و سەر چاکردنەوەی لەسەرە و دەبێ بۆی بدرێتن ، کەواتە ئەوە ڕاو بۆچوونی تەواوە کە لەسەر هەموو موسڵمانێکی واجبە و پێویستە گەورە و بچووکی بەڵام لەسەر کافر و بێ بڕوای پێویست نیە.

---

[1] أخرجه أبو داود (١٦٠٩)، وابن ماجه (١٨٢٧).





## چەند پرسیارێک :

لەپاشان بەڕێزان و خۆشەویستان پرسیارێک دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەی : ئەگەر ئافرەت هاوسەری هەبوو لەماڵی خۆی زەکاتەکەی بدات یا هاوسەر و پیاوەکەی بۆ بداتن ؟ زانایان دوو ڕاو بۆچوونیان هەیە هەندێکیان دەڵێن [ يجب علي المرأة ان تخرج صدقة الفطر من مالها ] واتە : پێویستە لەسەر ئافرەت خۆیەتی کە زەکاتی سەرفیترەی لەماڵی خۆی بداتن و دەری بکاتن ئەوە ڕاو بۆچوونی پێشەوا ثەوری و ابو حنیفەیە وە یوسف و محمدی قوتابیانی ابو حنیفیە وە ڕای پەسەند و هەڵبژاردەی ابن المنذر یشە ڕەحمەتی خودای لە هەموویان بێت کە دەڵێن بەڵگەشمان فەرموودەی عبداللّٰەی کوڕی عومەرە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە لەپێشتردا باسمان کرد کە فەرمووی لەسەر نێرینە و مێیینەی واجب کراوە بۆیە ئەوانیش دەڵێن دەبێ ئافرەت بەجیا لە پارەی خۆی بیداتن .

ڕاو بۆچوونی دووەمی زانایان کە ڕای جمهوور و زۆرینەیە لەوانە ئیمامی مالک و شافعی و احمد و لەیث و ئیسحاق و جگەلەوانیش فەرموویانە لەسەر مێرد وهاوسەری ئافرەتەکەیە کە زەکاتی سەرفیترە لەجیاتی خێزان و ئافرەتەکەی خۆی بداتن چونکە نەفەقە و خەرجی ئافرەتەکەش لەسەر ئەوە(پیاوەکەیە) ، جا ئەو ڕاو بۆچوونانەش هەیە ئێمەش قەناعەتمان بە ڕای دووەم هەیە کەوا پیاوەکان لەسەریانە کەوا ئافرەتەکان ئاگادار بکەنەوە کەوا پیاوەکە لەماڵی خۆی زەکاتی دەدات چونکە نەفەقەی ئافرەتەکەی لەسەر پیاوەکەیە (واللّٰه اعلم).

پرسیارێکی تر ئەوەیە ئایا منداڵ کە زەکاتی دەکەوێتە سەری دەبێ خۆی بیداتن یا وەلی ئەمرەکەی بۆی بداتن ؟ ئەوەشیان دوو ڕاو بۆچوونی لەسەرە کە زانایان هەندێکیان





دەفەرموون زەکاتی سەرفیترە لەسەر منداڵیە لەماڵی خۆی (ئەگەر منداڵەکە سەروەت و سامان و ماڵی خۆی هەبوو ) ئەوا وەلی ئەمرەکەی زەکاتەکەی بۆ دەردەکات لەماڵی منداڵەکە خۆی دووبارە بەڵگەیان اثرەکەی

عبداللّٰهی کوڕی عومەریە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە لەسەرەتادا باسمان کرد چونکە لە کۆتاییدا فەرمووی لەسەر گەورە و بچووکیە ، واتە منداڵ لەماڵی خۆیدا زەکات دەدات ئەگەر هەیبوو .

ڕاو بۆچوونی دوەمیش دەڵێت لەسەر باوک و وەلی ئەمرەکەیەتی ئەگەر و مابوون لە ژیاندا ئەوا وەلی ئەمرەکەی زەکاتی بۆ دەدات چ لە ماڵی خۆی بوو یا لەماڵی منداڵەکەی بوو یا هەر ماڵێکی تر بێت کەوا لەژێر دەستی بێت و حەلاڵ بێت و مۆڵەتی پێ بدرێت ، کە ئەوە ڕاو بۆچوونی محمدی کوڕی حەسەنە ڕەحمەتی خودای لێبێ.

ڕاو بۆچوونی سێیەمیش دەڵێن ئیللا واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە خۆی بەڕۆژووە ئەگەر بەڕۆژوو دەبوو کە ئەوە ڕاو بۆچوونی سەعیدی کوڕی مووسەییەب و پێشەوا حەسەنیە چونکە دەڵێن ئیبنو عەباس فەرمووی : « **فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ** » [1] واتە ئەوە ئەوەی دەگەیەنێ کە کەسەکە دەبێ بەخۆی بەڕۆژوو بێتن ئینجا سەرفیترەکەی لەسەرە و دەیداتن ئەگەریش منداڵەکە خۆی بەڕۆژوو نەدەبوو با باوکی بیداتن .

---

[1] أخرجه أبو داود (١٦٠٩)، وابن ماجه (١٨٢٧).





بەڵام ڕای پەسەند ئەوەی کە لەماڵی منداڵەکەی نا بەڵکو باوکەکە کە وەلی ئەمر و سەرپەرشتیاریتی چونکە نەفەقەی منداڵەکەی لەسەر باوکەکەیە بیداتن (والله اعلم بالصواب).

**پرسیارێکی** تر ئەوەیە ئایا کۆرپەلە و منداڵ کە لە ڕەحیمی دایکیتی زەکاتی سەرفیترەی لەجیاتی دەدرێت یاخود نا ؟ ڕا جیاوازی زانایانی لەسەرە کە زۆربەیان ڕایان وایە دەڵێن کاتێ کۆرپەلە لە ڕەحیمی دایکیتی زەکاتی لەسەر نیە بیداتن مەگەر پێش نوێژی جەژنە لەدایک ببێت وەک ئیجماعیان لەسەر نەقل کردووە کە ابن المنذر دەفەرمووێت : [ **وأجمعوا على أن لا زكاة على الجنين في بطن أمه** ] [1] واتە : کۆدەنگی زانایانی لەسەرە کەوا زەکاتی سەرفیترە بۆ ئەو کەسەی نادریت و واجب و پێویست نیە بدرێتت کەوا جەنینە و کۆرپەلەیە لەناو ڕەحیمی دایکیتی ، پاشان دەفەرمووێت[ **و انفرد ابن حنبل فكان يُحبه ولا يوجبه** ] [2] واتە : ئیبنو حەنبەل (ئیمام احمد) ڕاو بۆچوونی وابووە بەلایەوە باشتر بووە کە بدرێتن ئەگەر بێت و واجبیشی نەکردبێ.

ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێ پێویستە و واجبە زەکاتی سەرفیترە بۆ ئەو کۆرپەلەیە بدرێتن کە لە ڕەحیمی دایکیەتی  کە ئەو ڕایە گێڕدراوەیە لە احمد کوڕی حنبل وە ابن حزم وا دەڵێت بەڵام دەڵێ دەبێ ١٢٠ ڕۆژ بەسەر عەملی دایکەکەدا ڕۆیشتبێ لەناو ڕەحیمی دایکی و ڕوحی بەبەردا هاتبێ ئەوجا ئەوکاتی واجبە پاش (١٢٠) ڕۆژەکەی لەجیاتی وی سەرفیترەکەی بدرێتن (والله اعلم).

---

(١) الإجماع لابن المنذر صفحة (٥٥).

(٢) الإجماع لابن المنذر صفحة (٥٦).





بەڵام ڕاو بۆچوونی پەسەند و ڕاجح بەبەڵگەکانەوە ئەوەیە کەوا لەسەر ئەو کۆرپەلەیە نیە سەرفیترە مەگەر لەپێش نوێژی جەژن لەدایک ببێت (والله اعلم).

## چ کەسێ زەکات دەدا و کێ وەریدەگرێ؟

ابن النمذر (رحمه الله) دەفەرمووێت : [ **أجمع كلُّ مَن نحفظ عنه على أنَّ من لا شيء له فلا فطرة عليه** ] [1] واتە : کۆدەنگی ئەوانەی کەوا زانستی و عیلممان لێیان وەرگرتیە و پاراستوە و گواستیتمانەوە کە دەڵێن ئەگەر کەسێ نەبوون بوو هیچی نەبوو بۆ خواردن و خواردنەوە وە هیچی لە گیرفاندا نەبوو ئەو کەسە لەسەری نیە سەرفیترەی بداتن ، بەڵام ئەو کەسەی کە ضبت دەکرێ واتە دیاری دەکرێت کە هەیەتی بۆ سەرفیترە ڕا جیاوازی زانایانی لەسەر کەوتۆتەوە.

هەندێ لە زانایان بۆچوونیان وایە کە دەفەرموون : سەرفیترە واجبە لەسەر ئەو کەسەی کەوا لە قوت و بژێوی ژیانی خۆی زیاتری هەبێتن وە ئەوانەشی کە نەفەقەیان لەسەر ئەوە هی شەو و ڕۆژی جەژنە (واتە : وەلی ئەمرەکە قوتی خۆی و ئەوانەشی کە نەفەقەیان دەکێشی و بژێویان دەکەوێتە سەر ئەو ئەگەر خواردنی جەژنی هەبوو و درووستی کرد بۆخۆی و زیاتری هەبوو لەوە ئەوا واجب دەبێ لەسەری کە سەرفیترە بداتن کە ئەوە ڕای زۆرینەی زانایانی ئیسلامە . ڕاو و بۆچوونی دووەم دەفەرمووێ : لەسەری نیە ئەو کەسە بیدات ئیللا ئەگەر بەقەدەر نیصابی زێری یان زیو یا خانووی هەبێ کە زەکاتی بکەوێتە سەر ئەگەر لەوەی زیاتری هەبو ئینجا ئەو کاتە زەکاتی سەرفیترەی دەکەوێتە

[1] الإشراق لابن المنذر جلد (٣) صفحة (٧٤).





سەر ئەوە ڕاو بۆچوون و قەولی ابو حنیفەیە وە هەندێ زانای تریش وایان فەرمووە بەڵام زەحیف و لاوازە کە بەڵگەیان ئەو بابەیە : « **لاَ صَدَقَةَ إِلَّا عَنْ ظَهْرِ غِنًى** » [1] واتە : صەدەقە نادرێت و نیە ئیللا ئەگەر کەسێک هەبوون بێت و دەوڵەمەند بێت دەیدا ، ئەوان دەڵێن ئەو کاتی بە دەوڵەمەند حیساب دەبێ بەڵام ئەو ڕەئی و بۆچوونە لاوازە وئەو فەرموودەی پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵ ئەوەی نیە ، وە ڕای ڕاجع و پەسەند ئەوەیە کەوا هەر کەسێ خواردنی شەو و ڕۆژی جەژنی هەبێ وەکو بژێو و قوت بۆخۆی و ئەوانەشی نەفەقە و خواردنیان لەسەر ئەویە لەوەی زیاتری هەبوو سەرفیترەی بداتن و واجب دەبێ لەسەری وەکو ئیبنو عەباس فەرمووی « **فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ** » [2] باسی ئەوەی تێدا نیە کە فەقیر بێت یان دەوڵەمەند کەواتە ڕۆژووەوان مادەم ڕۆژووی گرتوە لەسەریەتی خۆی پاک بکاتەوە و سەرفیترەی بداتن و سەری خۆی چاک بکاتەوە.

## کاتی واجب بوونی زەکاتی سەرفیترە :

ڕاو بۆچوونی جیاوازی زانایانی لەسەرە ئایا کاتەکەی کەیە کە سەرفیترەکە بدرێت هەندێکیان دەڵێن : واجبە لە کاتی خۆر ئاوابوونی ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز و بەربانگ کرایەوە لەو کاتیەوە واجب دەبێت و ئەوشەوی لەسەرتە سەرفیترەکە بدەی کە ئەوە ڕاو بۆچوونی پێشەوا احمد و ئیسحاق و ڕیواتێک لە ئیمامی مالك و یەکێکە لە ڕاو بۆچوونە صەحیحەکانی ئیمامی شافعی و ڕای ئیمامی ثەوریشە (ڕەحمەتی خودایان

---

[1] كتاب الزكاة بابٌ(١٨) صفحة (٣٤٦) لە صەحیحی بووخاری .

[2] أخرجه أبو داود (١٦٠٩)، وابن ماجه (١٨٢٧).

لێبێت) کەئەوانە فەرموویتیان لەدوای خۆرئاوا بوونی ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز و بەربانگی کۆتایی ڕەمەزان سەرفیترەکە واجب دەبێ لەسەری .

ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن لەکاتی خۆرهەڵاتن و بەرەبەیانی (نوێژی بەیانی) لە ڕۆژی جەژندا ئەو کاتی فەرض واجب دەبێت کە ئەوە ڕاو بۆچوونی پێشەوا ابو حنیفە و هەردوو قووتابیەکەی ابو یوسف و محمد و لەیث و داود و وە ڕیواتێکیشە لە ئیمامی مالك و وە ڕیوات و قەولێکی ئیمامی شافعیشە .

## کاتی زەکات دان :

ڕا جیاوازی لەنێوان زانایان هەیە سەبارەت بەوەی ئەگەر کەسێ زەکاتی دا بەڵام کاتەکەی نەهاتبوو واتە ئەا کاتە نەبووبێ کە لەسەری واجبە ، هەندێکیان دەڵێن زەکات دەکەوێتە سەرت لە سەرەتای حەول و کاتەکەی بیدەی کە هێشتا ساڵەکەت تەواو نەکردبێ لەسەرەتایەکەی بیدەی درووستە و جائیزە دەڵێن هی وەش وایە ئەو ساڵەی کە سووڕاوە لە سەرەتای سەڵەوە دەتوانی بیدەی کە ئەوە ڕاو بۆچوونی ابو حنیفەیە بەڵام لاوازە

ڕاو بۆچوونێکی تر هەیە دەڵێن دەتوانی لەسەرەتای ڕەمەزانەوە پێشی بخەی هەر ڕەمەزان دەستی پێکرد دەتوانی بیدەی ئەگوە ڕاو بۆچوونێکی پێشەوا شافعیە چونکە دەڵێ صەدەقە و زەکاتی فیطر لەبەر بەڕۆژووبوونە ئەگەر ڕۆژووبوون وجودی هەبوو ئەگەر یەک ڕۆژیش بێت ئەوکاتی بۆت هەیە زەکاتی سەرفیترەی بدەی و سەرت چاک بکەیەوە

ڕاو بۆچوونی سێیەم دەڵێ دەتوانی ڕۆژێک یا دوو ڕۆژ پێش ئەوەی جەژنە بێت( واتە ڕۆژی ٢٧ بەسەرەوە ) زەکاتی سەرفیترەکەی بدەی کە نافع لە عبداللهی کوڕی عومەرەوە





دەیگێڕێتەوە ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێبێ دەفەرموویێت : [ **كَانَ يَبْعَثُ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَى الَّذِي يجْمَعُ عِنْدَهُ قَبْلَ الْفِطْرِ، بِيَوْمَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ** ] [١] واته : هەمووجار ئەوانەی دەینارد بۆ ئەوەی زەکاتی سەرفیترەیان پێ کۆبکاتەوە بە دوو ڕۆژ یا سێ ڕۆژ لەپێش دەینارد ،

« **وَكَانُوا يُعطُونَ قَبلَ الفِطرِبِيَومٍ أَويَومَينِ** » [٢] واته : زەکاتیان دەدا بە ڕۆژێک یا دوو ڕۆژ (لەپێشی جەژنەی) ، ابن قدامە (رحمە الله) لەسەر ئەو فەرموودەیە دەڵێت ئاماژەیەکە بۆ هەر هەموویان واتە دەتوانین بڵێن ڕۆژێک دوو ڕۆژ پێش جەژن زەکاتی سەرفیترە درووست دەبێت

ڕاو بۆچوونی چوارەم و کۆتایی دەڵێن نابێ لەپێش نوێژی بەیانی (جەژن) پێشبخستریّ

جا لەهەرهەموویان ڕاجیع تر و صەحیح تر کە بەبەڵگەوە بێت ئەوەیە کە دەتوانی دوو ڕۆژ پێشی جەژن وە لەپاشان شەوی جەژنە وە لەپاشان بەیانی جەژنە ئەوانە ئەو ڕەئیە پەسەندانە کە بەڵگەیان لەسەرە بەڵام ئەگەر کەسێک لە توانایدا نەبوو بە ڕەئی ئیمامی شافعی بکاتن پێمان وایە (والله اعلم) پێکایتی ئاساییە لەسەرەتای ڕەمەزانێش ئەگەر نەیزانی و لەبیری بچێت یان ساڵانی تریش نەیتوانیە و لەبیری کردیە بیداتن ئەگەر دای (والله اعلم لێی قەبووڵ دەبێت).

---

[١] موطأ الإمام مالك، كتاب الزكاة، باب وقت إرسال زكاة الفطر، برقم (٥٥).

[٢] صحيح البخارى (١٥١١).

## ئایا دەكرێ زەكات لە كاتی خۆیدا نەدرێت؟

درووست نیە و ڕاو بۆچوونی جیاوزی لەسەرە بەڵام ڕای پەسەند لەسەر ئەوەیە كەوا درووست نیە بۆ دوای جەژن دوابخرێت دەبێت لەپێش نوێژی جەژن سەرفیترەكە بدرێتن ئەگەر دوای جەژن بیدات ئەوا حیساب نابێت مەگەر كەسێ نەبوون بێت ئەوكاتی قەرەبووی دەكاتەوە كە هەیبێ و لە توانایدا هەبێ (والله اعلم) هەرچەندە زانایان ڕای جیایان هەیە هەندێكیان دەڵێن درووست نیە دوای بخەی تاوەكوو ئیمام نوێژی جەژن دەكاتن بەڵكو لەپێشتردا دەبێ بیداتن وە ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن : ئەگەر دوایخست تاوەكوو ئیمام نوێژی كرد و لەو ڕۆژە سەرفیترەكەی دا ئەوا تاوانبار نابێ و گوناهبار نابێت ، وە ڕاو بۆچوونی سێیەم دەڵێت : ئەگەر لە ڕۆژی یەكەژی جەژندا تێپەڕ بوو و دوای خست ئەوا درووستە و جائیزە بەڵام زۆر دوای نەخات ، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە كە دەبێ پێش نوێژی جەژن بیدات نابێ لەدوای جەژن بیداتن والله اعلم.

## زەكات بە كێ دەدرێ؟

ابو سەعیدی خودری ( رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ ) دەفەرموویێت : « **كُنَّا نُعْطِيهَا فِي زَمَنِ النبى – صلى الله عليه وسلم - صَاعاً مِنْ طَعَامٍ , أو صَاعاً مِنْ تَمر , أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ , أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ , أَوْ صَاعاً مِنْ زَبِيبٍ. فَلَمَّا جَاءَ مُعَاوِيَةُ , وَجَاءَتِ السَّمْرَاءُ , قَالَ: أَرَى مُدًّا مِنْ هَذِهِ يَعْدِلُ مُدَّيْنِ** [١] . **قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا أَنَا: فَلا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ** [٢] **- صلى الله عليه وسلم -** » واتە : ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری پێشەوا

---

[١] رواه البخاري (١٥٠٨)، ومسلم (٩٨٥) وابو داود (١٦١٦) والنسائى (٢٥١٣) والترمذي (٦٧٣) وابن ماجه (١٨٢٩).

[٢] قول أبي سعيد رواه مسلم (٩٨٥) (١٨).

(ﷺ) یەک ڕبە (واتە : صاعێک) لە خواردنمان دەدا (بۆ هەر سەر چاکردن و زكاة الفطر) یا صاع و ڕبەیەکمان لە خورما و قەسپی دەدا وە یان صاع و ڕبەیەکمان لە (جۆ)ی دەدا یا صاع و ڕبەیکمان لە شیری وشک کراوە دەدا ( واتە شیری ئاژەڵیان دەکوڵاند ئینجا وشکیان دەکردەوە و دەیانکردە زكاة الفطر وەکو ئێستاکە پەنیر و زبدەی لێ بەکار دەهینرێت) وە یا ڕبەو صاعێکمان دەدا لە مێوژ (بۆ زكاة الفطر) کاتێک موعاویە هاتە سەر فەرمانڕەوایی وگەنمی شام هات بۆ ناو شارەکان موعاویە وتی: مستێک لەوەی بەقەد دوو مستی ئەوەی ترە بەڵام ابو سعید فەرمووی : من هەروەکو خۆی چۆن لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) صاع و ڕبەم دەدا بۆ زەکات ئێستاش لێم کەم نەکردبۆوە و نەم کردبووە نیو صاع ، لێرە کە دەڵێ (السَّمْرَاءُ) مەبەستی پێ گەنمە واتە لەگەنمی نیوەی دەکردەوە  کاتێ کەوا موعاویە هات وتی ئەگەر دوو مست لە جۆ دەدەن یەک مست لە گەنم بدەن وە ئەگەر صاعێکتان دەدا بیکەنە نیو صاع بەڵام ابو سعید دەڵێ من بەیەکسانی لەویش هەر صاعێکم دەدا وە لەویش نیوەم نەدەدا وە لەجیاتی یەک مستی دوو مستم دەدا ،جا لەو فەرموودەیەدا چەند شتێک بەدیار دەکەوێت و سێ ڕاو بۆچوونی لێ دەبێتەوە وەک زانایان دەفەرموون لە ڕای یەکەمیان: ئەگەر قووت و بژێ و ژیانی خەڵکی ئەو وڵاتە و ئەو ئاوەدانیە لە هەر سەردەمێکی لەسەر چ بوو لەوی زەکات دەدەن کە فەرزە لەسەریان (واتە ئەگەر گەنم بوو بژێوی خەڵکەکەی با زەکاتەکە لەگەنمی بدرێت ئەگەر خورما بوو لە خورما بدرێت ئەگەر جۆ بوو لە جۆ بدریت وە ئەگەر برنج وەک سەردەمی ئێستاکەی ئێمە با لە برنجەکەی بدرێتن) ئەوە ڕاو بۆچوونی

زۆربەی زانایانە وەک ئیمامی مالك و شافعی وە مەذهەبەکانیشیان لەسەر ئەو ڕاو بۆچوونەن .

ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن : ئەو صنف و پۆل و شتانەی پێغەمبەر دیاریکرد (ﷺ) لە سەردەمی خۆی کە پێنج شت بوو ( خورما و مێوژ و گەنم و جۆ و شیری وشک کراوە ) کە ئەوە ڕاو بۆچوونی مەذهەبی ئیمامی احمدی کوڕی حەنبەلە (رحمه الله) بە بەڵگەی ئەو ئەثەر و فەرموودەی کە لەپێشتردا گێڕامانەوە هی ئەبوو سەعیدی خودری ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتبوو .

ڕاو بۆچوونی سێیەم دەڵێن کەسەکە سەرپشکە هەریەک لەو صنفانە لێی بداتن کە ئەوە ڕاو بۆچوونی مەذهەبی ابو حنیفەیە وە دەڵێن دەتوانی تەقیمیشی بکات بە پارە کە پارەی لەجیاتی بداتن لەجیات ئە وشتەی کە بژێوی لەسەریەتی.

بەڵام کورتەی قسان ئەوەی دەڵێین : پێویستە موسڵمان تەماشا بکات و سەرنج بداتن خۆ ئەگەر ڕاستەوخۆ وەک فەرموودەکەی پێغەمبەری بوو (ﷺ) و سوودی بە خەڵکیش دەگەیاند باشە ، بەڵام لەهەموو ڕەئیەکان مامناوەندی تر و پەسەندی تر و تەواو تر ئەوەیە کەوا قوت و بەلەد و شوێنەکەی بداتن فەقیر و هەژارەکان سوود لەوەی دەبینن بۆ نان و خواردنی جەژنەیان (والله اعلم) ، لەولاشەوە ئەگەر سەیری ڕاو بۆچوونی یەکەم بکەین کە کێ پەسەندی کردووە دەبینین ابن تیمییە و ابن قیم الجوزی تەحقیقیان کردووە و دەڵێن بەڵێ ئەوە پەسەندە قوتی بەلەد و شوێنەکە چی بوو زەکاتەکە لەو بدرێ ئەوە سوود و کەلکەکەی بە خەڵکی دەگەیەنیت ، بەڵام ئەوەشی بە پارە دەیداتن ئێمە ناڵێن هەڵەت کردووە بەڵام دەڵێین ڕەئیەکی لاوازت هەڵبژاردووە

قوتەکەی بەلەد لە هەموویان باشتر و پەسەند ترە خۆ ئەگەر کەسەکان هان بدەین لەسەر وەی بەهەردوو جۆریشیان بدات پارەکە بۆی ببێتە صەدەقە فەقیر و هەژارەکە زیاتر فائیدەی دەکەن وە بە قووتی بەلەدیش کەوا بیداتن باشە بۆ نمونە بە سەردەمی ئێمە و لە وڵاتی ئێمە کەوا برنجە با لێی بداتن ئەوکاتی باش دەردەچیت ،جا باشتر وایە ئەو برنجەی کەخۆت دەیخۆی لەویەوە ببەخشی نەک برنجی خراپیان بۆ دیاری بکەی و پێیان بدەی ، تێبینیەیکی تر کەوا زۆرجاران دەبینین کاتێ خەڵکەکە فەتوایان بۆ دەدرێتن لە لایەنە کەمیەکەیە چ لە پارەیە لە وڵاتەکان چ لە خواردن و قوت و بژێوی ژیانی پێ هەیە خۆ ئەگەر لەویەوە زیاتری بدات چاکترە وصەدەقەیە بۆی ناڵێین هیچ ڕێگریەک هەیە مەرج نیە ئیللا لایەنە کەمییەکەی بدات با لایەنە زۆریەکەی بداتن ئەوە بە کۆدەنگی زانایان و موسڵمانان .

## زەکات چەند دەدرێت؟

ڕاو بۆچوونی یەکەمی زانایان لەسەر ئەوەیە کەوا زەکاتی سەرفیترەی یەک ڕبەیە(صاع)ـێکە لە جیاتی هەر کەس و مرۆڤێکی موسڵمان لە هەریەک لەو جنسانەی کە گوتمان لە خواردن و خۆراکەکان و بژێوەکانی ژیان جا چ گەنم بێت چ جۆ بێت چ برنج بێت کە قوتی بەلەد ئێستا برنجە لە وڵاتەکەی خۆمان ، جا ئەوە ڕاو بۆچوونی پێشەوا مالك و پێشەوا شافعی و پێشەوا احمد و ئیسحاق و وە لە ابو سعیدی خودریەوەش گێڕاوەیە وک لە فەرموودەکەی هێمانەوە وە ڕای ابو العالیە و پێشەوا حەسەنە کە بەڵگەیان فەرموودەکەی سەعیدی ابو خودری گێڕایەوە لە سەرەتا بۆمان هێنانەوە ،

ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێ : هەریەک لەوانە دەتوانی نیو ڕپە(صاع)ی بدەی بەڵام بە تایبەتتر لە گەنمی چونکە پێیان وایە گەنمەکە باشترە لەبەر فەرموودەکەی سەعیدی ابو خودری کە موعاویە گوتی مستێکی گەنمی بەقەد دوو مستی جۆ و ئەوانی ترە کە دیاری کرابوو ئەوەش ڕاو بۆچوونی سەعیدی کوڕی موسەیەب و عەطاء طاوس و مجاهید و عومەری کوڕی عبدالعزیز و عورووەی کوڕی زووبەیر و ئەبو سەلەمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و وە هەندێک لە خاوەن ڕەئیەکان و پێشەوا ثەوریە وە گێڕدراوەیە لە هەر چوار خەلیفەی ڕاشیدەینی موسڵمانان (کە ابو بکر و عومەر و عثمان و علی)ین ڕەزا و ڕەحمەتی خودا لەهەمویان بێت .

لە پاشان ڕای پەسەند لەو ڕایانە دەتوانین بڵێین ئەوەیە کەوا انسان باشتر و چاکترە کە هەمووی بەیەک چاوی تەماشا بکات و ڕپەیەک (صاع)ـێک بداتن و کەمتر نەداتن وە لە صاعێک کەمتر نەداتن ، زانایانی سەردەم تەقییم و هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەو ڕپەیە کردیە کە دەڵێن یەک ڕپە (صاع) دەکاتە دوو کیلۆ و چل غرام وە هەندەک دەڵێن دەکاتە سێ کیلۆ جا ئێمە ئەگەر اعتیاتەکەی وەربگرین لەبەین و نێوانی هەردووکیان دەفەرموون بۆ هەر کەس وسەرێکی دوو کیلۆ و نیو بدرێن لە هەر یەک لە شتەکان کە هیچ جیاوازی و ئیختیلافێکی ئەوتۆ ناگرتەوە کە ئەوە لایەنە کەمیەکەیتی ئەگەر لایەنە زۆیەکەی بدات باشترە و خێرترە و کۆدەنگی زانایان لەسەر وەیە کە خێری زیاتری پێدەگات بەڵام لە لایەنە کەمیەکەی نابێ کەمتر بێ و لێی کەم بکەیەوە (والله اعلم).

## ئایا ئاردی گەنم و جۆ لەجیاتی گەنم و جۆ بۆ زەکات دەدرێت؟

ئەوەش ڕا جیاوازی زانایانی لەسەرە هەندێک لە زانایان دەفەرموون دروستە وەک پێشەوا احمد پێی درووستە بە یەکێ لە قەول و قسەکانی وە ابن سیرین ئەوەی لێ گێڕدراوەیە دەڵێن درووستە چونکە دەڵێن لە هەندێک ڕیوایەت لە ابو سعیدیەوە ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) کە دەفەرمووێت : « أَوْ صَاعًا مِنْ دَقِيقٍ » [1] واتە : یا صاعێک (ڕبەیەک) لە ئاردی ، بەڵام ئەو زیادەیە کە ابو عیینە لە ابو سعیدی گێڕایتیەوە دەڵێن هی ابو سعیدی نیە و فەرموودەکە لاوازە (کەواتە بەڵگەکەیان زۆر بەهێز نیە کە دەڵێن دەبێ ئاردی جۆ بدرێت لە جیاتی جۆ وە ئاردی گەنمیش بدریت لەجیاتی گەنمی).

ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن : درووست نیە ئارد بدرێت بۆ زەکاتی سەرفیترە ئەوە ڕاو بۆچوونی پێشەوا مالك و شافعیە چونکە دەڵێن گەنمەکە کە کرایتە ئارد کەم بۆتەوە و لەسەر سرووشتی خۆی نەمایە و سوود و کەلکی کەمتر دەبێ بۆیە ئاردەکە جێگای گەنم و جۆیەکەی ناگرێتەوە دەبێ لە خوودی گەنم و جۆیەکەی بدرێت) [والله اعلم]

## ئایا درووستە پارە بدرێت لە جیاتی قوت و بژێوی بەلەد و وڵاتەکە؟

پرسیارێکی تر دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە ئایا دەکرێ لەجیاتی قوت و بژێوی وڵاتدا پارە بدرێت وەک زەکات؟ ، کۆمەڵێ زانا ڕاو بۆچوونیان وایە وەک امام مالك و شافعی و احمدو ابن المنذر (ڕەحمەتی خودایان لێبێ) کە دەفەرموون : قیمەت واتە پارە لەجیاتی سەرفیترەی نادرێتن و درووست نیە . ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن درووستە قیمەت (پارە)

---

[1] ضعيف سنن النسائي (158 / 2514).

بدرێتن لەجیاتی قوت و بژێوی کە ئەوە ڕاو بۆچوونی ابو حنیفە و امام ثوری و حسن البصری و عمر بن عبدالعزیز و اسحاق و ابو ثور فەرموویەتیان بەڵام ابو ثور وای فەرمووە [ **لا تجزئ إلا عند الضرورة**. ] [١] واتە : ئەگەر خەڵک پێداویست بوون و زەرور بوون ئینجا دەدرێت.

ڕای پەسەند ئەوەیە کەوا بەڵێ هەتا بکرێت دەبێ لە قوت و بژێوی بەلەددا زەکاتی سەرفیترە بدرێت وەکو زانایان دەفەرموون ئەوەیان ئەدەبێکی جوانترە بەرامبەر ئەثەر و فع و کردار و هەڵسووکەوت و گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) و سەلەفی ساڵح بەڵام ئەگەر زەرورات بوون و زانیان خەڵکی زانا لێی ورد بوونە کە زانیان خەڵکە فەقیرەکە پێویستیان بە پارەیە زیاتر ڕێگایان پێ دەدرێت لەسەر قسەکەی (ابو ثور)ــی **[والله اعلم بالصواب]**.

## ئایا زەکات بەکێ بدرێت و بە کێ دەشێت؟

ڕاو بۆچوونی جیاوازی لەسەرە ئایا سەرفیترە دەدرێتە ئەوانەی کەوا هەشت صنف و پۆلەکەنە کە لە قورئاندا خودای گەورە (ﷻ) باسی کردووە یان دەدرێتە چەند صنف و پۆلێکی دیاریکراو جگەلە ئەوان؟

١- هەندێکیان دەڵێن سەرفیترە دەدرێتە هەر هەموو ئەوانەی کەوا هەشت صنفەکە کە لە قورئاندا خودای بەرز (ﷻ) باسی کردووە کە دەفەرمووێت : ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾ صدقات مەبەست پێی زەکاتی فەرضە لێرەدا کە دەدرێت بە هەشت پۆلەکە پۆلی

[١] المجموع للنووی جلد (٦) صفحة (١١٢).

یەکەم بریتین لە فەقیر و هەژارەکان کە زانایان وا پێناسەیان کردیە دەفەرموون : بریتین لەوانەی کەوا زۆر پێداویستت و مانگانە لەسەر بژێوی کەمتریان دەست بکەوێت و قەرزار ببنەوە لەسەری (بۆ نموونە ئەگەر مانگانە پێویستیان بە ٣٠٠ هەزار دیناری بلیمەری بێت و خۆیان ١٠٠ هەزاریان هەبێ و ٢٠٠ هەزار قەرزار ببنەوە لەسەری و لەنیوە کەمتریان هەبێ پێی بژین ئەوانە فەقیر و هەژارن) پۆلی دووەم ()ـن کە زانایان بە بەراورد بە فەقیری دەڵێن تۆزەک پلەی بەرزترە لە هەبوونیەت (واتە ئەگەر مانگانە ٣٠٠ هەزاریان بوێت بۆ بژێوی ژیان وخۆیان ٢٠٠ هەزاریان هەبێ و ١٠٠ هەزار قەرزار ببنەوە لەسەری و ئەگەر بڕێکی کەم قەرزار بونەوە نەگەیشتە نیوەی ئا بەوانە دەگووترێ میسکین پۆلی هەژارایەتی نەبوونیە ، ئەوانە پۆلی یەکەم و دووەم بوون) پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت ﴿وَٱلۡعَـٰمِلِينَ عَلَيۡهَا﴾ واتە : وە ئەوانەی زەکات کۆکردنەوە و بەخشنی زەکات دەکەن بە خەڵکەکەی (واتە ئەوانەی ئیش و کاری زەکات دەگرنە ئەستۆ کە خودای گەورە (ﷻ) دەفەرمووێت ئەوانیش زەکاتیان پێ دەدرێت چونکە خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ ئیش و کاری زەکات ، ئەوەیان پۆلی سێیەم بوون) پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت : ﴿وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ﴾ واتە : ئەوانەشی کە تازە بوونەتە موسڵمان و نزیکن لەسەردەمی کوفریەوە (بۆ ئەوەی دڵیان بەرەو ئیسلام بێت یان زانایان دەفەرموون هەستی ئەوەی پێ دەکەی کەوا دەیەوێ ببێت بە موسڵمان و کەمێکی ماوە و دڵی نەرم بووە زەکاتی پێ دەدرێت هەتا دڵی خۆشتر بێت و موسڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت ، ئەوە صنف و پۆلی چوارەم بوون ) پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت : ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾ واتە : وە ئەوانەش کە کۆیلە و عەبد و بەندەنە دەیانەوێ خۆیان بکڕنەوە و (خۆیان ڕزگار بکەن

لە کۆیلایەتی ، ئەوە صنف پێنجەم بوون ) پاشان خودای گەورە دەفەرموویت :﴿وَٱلۡغَٰرِمِينَ﴾ واتە : وە ئەوانەی قەرزیان کەوتۆتە سەر و ناتوانن قەرزەکەی بدەنەوە (هەندێ لە زانایان دەفەرموون دەبێ مەرجی ئەوەیان لێ بێتە جێگا کە قەرزەکەیان لەپێناو کارێکی خێر و باش کردووە یان حادیثە و ڕووداوێکییان بەسەردا هاتبێ پارەیان بۆ قەرز کردبێ نەک بۆ تاوان و گوناھ و شکستیەکی دوونیایی بێت ، ئەوە صنفی شەشەم بوون ) پاشان خودای گەورە دەفەرموویت :﴿وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە : وە ئەوانەی لەبەر ڕاهی خودای و لەپێناو خودای دەجەنگ و موجاهیدن و لەمەیدانن (هەندێ لە زانایان دەفەرموون ئەگەر دەوڵەمەندیش بن زەکاتیان پێدەچێت ، ئەوە صنفی حەوتەم بوون ) پاشان خودای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ﴾ واتە : وە ئەوانەش کەوا لە سەفەر وگەشتێکیدانە و پارەیان لێ دەبرێت و کەسیش ناناسن لەو شوێنەیدا زەکاتیان پێ دەچێ هەتا دەگەنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان و کار و ئیشەکەیان پێکدێ ، ئەوە صنفی هەشتەم بوو ﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ واتە : ئا ئەوە فەڕض و پێویست کرا لەلایەن بەسەرتان(کە بدرێتە ٨ صنفەکەی) ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠﴾[1] واتە : خودای پەروەردگار هەم عەلیم و زانایە هەم حەکیم و دانایە ، جا لێرەدا زانایان دەفەرموون : زەکاتی سەرفیترە بەو هەشت صنفە دەچێت وەکو زەکاتی وایە چونکە سەرفیترەش جۆرێکە لە جۆرەکانی زەکات . زۆر جار پرسیارمان لێ دەکرێت ئایا زەکات دەدرێتە دەزگا ئیعلامی و ڕاگەندنەکان بەوەی کە گوترایە (فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ) واتە لەپێناوی خودای پێیان ببەخشرێ کە ئەو ئیعلامیانە خۆیان هێناوەتە ئاستی موجاهیدان و ئەوانەی لەپێناو

---

[1] سورة التوبة – آية ٦٠.

خودای گەورە دەجەنگن بەدڵنیایەوە نادرێتە ئەوانە چونکە زۆر جار کەم و کورتی و تاوان و گوناهی وایان هەیە و شتی وا ئەنجام دەدەن نیشان دەدەن شکستیە بۆ ئیسلام و موسڵمانان نەوەک سەرکەوتن بێت کارەکەیان زۆر دوورە لە کاری موجاهیدین ئەوانەی خودای گەورە (ﷻ) لە قورئاندا باسی کردوونە ، جا زەکات نادرێتە ئەوانە و بەدڵنیاییەوە ئەوانەی پێیان دەدەن بابزانن زەکاتەکەیان لەماڵەوە دەرنەچووە و هەر لەسەریان ماوەتەوە (والله اعلم).

٢- جا ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن زەکاتی سەرفیترە ئیللا دەدرێتە فەقیر و مسیکینەکان ئەوانەی لەسەر بژێو و ژیانی ڕۆژانەی خۆیان قەرزار دەبنەوە و نادرێتە ئەوانی تر (ئەو ڕەئیەشیان پەسەندە والله اعلم) کە ابن تیيمه و ابن القيم الجوزيه و ئیمامی شەوکانی دەڵێن ئەو ڕەئیە پەسەندترە کە تەنها بدرێتە نەبووەکان و هەژار و فەقیرەکان ئەوانەی لەسەر بژێوی ژیانی ڕۆژانەیان قەرزار دەبنەوە چ کەم چ زۆر زەکاتی سەرفیترەیان بدرێتێ نەک بدرێتە هەموو پۆل و هەشت صنفەکانی تر کە لە سورەتی تەوبە ئایەت ٦٠ هاتبوو

## حوکمی ئەوانەی زەکات نادەن:

ئەوانەی زەکاتی نادەن لەو دوو حاڵەتەی بەدەر نین:

١- ئەوانەن بڕوایان بە زەکاتی نیە کە بەیەک دەنگی زانایانی ئیسلام بەبێ ئیختیلاف و جیاوازی کافر دەبن دەستبەجێ هەڵدەگەڕێنەوە لە ئیسلام و حاکمی ئیسلام بانگیان دەکاتن مۆڵەتیان پێ دەدات و داوای تۆبەیان لێ دەکات ئەگەر تۆبەی نەکەن لەسەریان دەدا و بە کافری دەمرن

٢- وە ئەوانەشی باوەڕیان پێ هەیە و بەواجبی دەزانن و پێیان شەرعیە بەڵام وەکو هەندێک لە دەوڵەمەندەکان (لەساڵی هەشتایەکان من منداڵ بووم جارێکیان لە لای بەڕێز شێخ فایەقی نەوەی شێخ مستەفای ماڵە خاڵەکانی ئێمەنە و خزمایەتیمان هەیە لەلای دانیشتبووین لەگەڵ باوکموان قسەیەکی سەیری گێڕایەوە شێخ فایەق وتی ئەوڕۆکە من لە عیادەی بوومە تەبعەن دکۆری سۆنەر و ئەشیعەیە وتی دەوڵەمەندێک ناوی هێنا ئەو کاتی ئێمە حەز ناکەین ناوی بینین ئی ساڵی ٨٠یەکان بوو زۆر دەوڵەمەند بوو وتی هاتبوو ئەشیعەیەکی پێویست بوو پێم وت زەکاتی ماڵی رب العالمین ـت بە مضبوتی دایە فلانە کەس وتی کابراش برێکی داما و شێخ فایەق وتی جوابی منی داوە و وتی وەللەی جەنابی شێخی چت پێ بڵێم زەکاتدان جەرگی دەوێ وتی ئەوجار زانیم تەواوی نەدایە و پێی ناخۆشە کە زەکاتەکەی دەدات چونکە وا دەزانی ئەو پارەیە بەخۆی بەخشیتیە خۆی وا دەزانی ئەو ڕزقە بەخۆی بۆخۆی هینایە دیارە بڕوای لاوازە و زەعیفە یان نیتی پەنا بەخودا رب العالمین بەوەی کە هەیتی و نیتی خودا دایتیە وی گیان و ژیانی خۆی بەدەست نیە ئەگەر هەناسەکەش خودا پێی نەبەخشی ناتوانێ بژێ)جا لەبەر ئەوەی ئەوانەشمان هەن کە بڕوایان بەواجب بوونی زەکات هەیە بەڵام بە عەمەلی وکرداری یان هەر نایدەن نایدەن یان کەمێکی کەم دەدەن یا بەحیسابی خۆیان فێڵ لە خۆیان دەکەن و فێڵ لەخودای ناکرێت شتێکی وا دەکەن کەئەننەهوو دەوڵەمندە و زەکاتی دەداتە کچ و کوڕی خۆی کە لەبۆ ئەوانە ناشێ ئەگەر دەوڵەمەند بێ و بتوانی نەفەقەیان بکێشی و بیانداتێ یانیش بە مانگێک پێش ئەوەی زەکاتی بکەوێتە سەر دەچێت بە سەروەت وماڵ و موڵک دەدا و سەیارە دەکڕێت و پارەکەی نایەلیت و زێڕەکەی نایەلیت ئەوجا پاش دوو مانگی

دەیفرۆشتەوە ، ئەوانە هەموو فێڵ کردنە و نەدانی زەکاتە بە ئەنقەست (بەڵام خۆ فێڵ لە خودای گەورە ناکرێت) ، یا بیستیتمان کە ئافرەتان بەتایبەت ئافرەتی هەولێری هەیانە دەوڵەمەندە و زۆر عاشقی زێڕن کە پرسیاریان لە ئێمە کردیە دەڵێ مامۆستا پێنجسەد مسقاڵ زێڕم هەیە بەخۆمەوە دەکەم (تەمەنیشی زۆرە و بەڕێزە بەڵام پێم گوت دایکی من پێنج سەد مسقاڵی بەخۆت وەبکەی کوورٍ دەبیەوە و ناتانی بڕۆی ئەو هەموو قوورٍساتیەت چۆن پێ هەڵدەگیرێ ) هەتا ئەگەر بەخۆشت وەبکەی لە حەدی مەعقول دەرچووە ئەوە خۆشاردنەوە و خۆدزینەوەیە لە زەکاتدان خۆ ئەگەر زەکاتی لێبدەی بەرەکەتی زیاتر دەبێ ، یان هەیە دەڵێ مامۆستا خێزانەکەم سەت وپەنجا یا دوو سەت مسقاڵ زێڕی هەیە بەخۆیەوە وەناکات و خولق و زەوقی ئەوەی نیە و تەمەنێکی بەسەر بردیە بەڵام ساڵێ جارێک بەخۆیەوە وەدەکاتن دەڵێ با زەکاتی لێ نەکەوی وام بیستیە لە مەلا و مامۆستایەکان ، ئەوانە هەموو خودای گەورە (جل شأنه) بەنیەتیان ئاگادارە ، کەواتە لە ژنان و پیاوان لەناوماندا هەیە خۆی دەدزنەوە لە زەکات. جا هەریەکێ زەکات نەداتن و باوەڕیشیان بە واجب بوونی هەبێ ئەگەر حاکمی ئیسلام هەبوو حاکمەکە

لەسەری فەرض و واجب دەبێ بە زۆرەملێ لێیان بستێنی و و بانگیان بکات و حەپسیان بکات و ئەزیەتیان بدات هەتا زەکاتەکەی هەموو درهەم بە درهەم و فلس بە فلس لێوەردەگرێت و ئەوجە ئەوکاتی بیداتە فەقیر و هەژاران حەتا زانایان دەفەرموون ئەگەر ئەوانەی زەکاتەکەیان نەدەدا و قوەت و هێزیان زۆر بووە لەسەر حاکمەکە فەرض دەبێ کە لەشکری بنێریت و شەڕیان لەگەڵ بکات تا زەکاتیان لێ دەستێنی چونکە ئیمامی ابو بکری الصدیق ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە یەکەم خەلیفەی پێغەمبەری خودای بوو (ﷺ)

ئەوانەی زەکاتیان نەدا لەشکری ڕێکخست و فەرمووی : کوشتارتان لەگەڵ دەکەم وەڵڵەی یەک پەتکی ئاژەڵ و مەڕ و بزنی کە پێی بەسترابێتەوە دابتانە پێغەمبەری خودای (ﷺ) وەک و صەدەقە وەکو زەکات ئەوڕۆ نەیدەنە من دەتانکوژم ئیمامی عومەر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی ئەوە ڕاستە ئەی ابابکر چۆن دەبی بیانکوژین؟ فەرمووی : سوێند بەخودای ئەوە ڕاستە یەک پارچە پەتک کە قیمەتی نیە مەڕ و بزنی پێ دەبەسترێتەوە دابیانە پێغەمبەری خودای(ﷺ) ئەوڕۆ نەیدەنە من و بیدەمە (بیت المال)ـو موسڵمانە فەقیر و هەژارەکان دەیانکوژم ئەوجا ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : وەڵڵەی بۆم بەدیار کەوت کە ابو بکری صدیق لەسەر حەق بوو ، ابو هورەیرە دەفەرمووێت : « **لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ العَرَبِ، فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ؟ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالًا كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ، فَقَالَ عُمَرُبْنُ الْخَطَّابِ: فَوَاللهِ، مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللهَ عَزَّوَجَلَّ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ.** »[١]

واتە :کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد ئیمامی ئەبوو بەکر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بووە سەرپەرشتیاری موسڵمانان خەلیفەی یەکەمی ئیسلام وە هەندێک لە عەرەبەکان هەڵگەڕانە و کافر بوونەوە وە عومەری کوڕی خەطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی یا

[١] أخرجه البخاري (7284، 7285)، ومسلم (20)، وأبو داود (1556)، والترمذي (2607) واللفظ له، والنسائي (3970)، وأحمد (117).

ابابکر تۆ ئەو لەشکرەت ڕێک خستووە دەڵێی کووشتاریان لەگەڵ دەکەی چونکە زەکاتی نادەن و هەنێکیان هەڵگەڕاینەوە چۆن کوشتاریان لەگەڵ دەکەی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : فەرمانم پێکراوە کوشتار بکەم لەگەڵ خەڵکی هەتا ئەو کاتەی کەسێ دەڵێت لا اله الا الله خوێنی حەڕام دەبێ و ماڵ و سەروەت و سامانی بەتاڵان نابردرێ مەگەر بەحەقی خۆی وە حیسابیشی لەسەر خودایە ئیمامی ابو بکر ڕووی کردە امامی عومەر فەرمووی وەللّٰەی من ئەو کەسەی دەکوژم کە جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکاتی (بڵێ نوێژی دەکەم بەس زەکاتی نادەم یا بڵێ نوێژی دەکەم و گەورەیە بەڵام زەکات قەیناکەئەگەر نەشی دەم ) ، چونکە (چۆن نوێژ عیبادەتە بۆ خودای رب العالمین) زەکاتیش حەقی ماڵ و سەروەتەکەیتی دەبێ بیدات و پاکی بکاتەوە وە وەللّٰەی ئەگەر بەقەدەر عەگالێک پەتێکی ئەوها بچووک کە وەکو تایەیێکی خڕ وایە دابیانە پێغەمبەری خودای (ﷺ) لەکاتی خۆی ئێستا نەیدەن بۆ ئیسلام سوێند بەخودا دەیانکووژم و کوشتاریان لەگەڵ دەکەم (جا وای کرد) پاشان عومەری کوڕی خەطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ )فەرمووی : ئەوجا بۆم بەدیار کەوت خودای رب العالمین دڵی ئیمامی ابو بکری تەواو جێگیر کردبوو بۆ ئەو جەنگ و کوشتارەی لەگەڵیان وە زانیم ئەو حەق و ڕەوایە .

بەڕێزان ئەوەی زەکاتی ماڵی خودای نادات قوڕی بەسەر لەبەر ئەوەی فەقیر وهەژار هەر وەک خۆیان دەمێننەوە و ئەویش ئەوەندەی کە هەیتی هی خۆی نیە و خودا پێی دایە و خودا ئەو حەقەی لەسەر دانایە کە قەدەغە دەبێ دوژمن کاری ودوژمنایەتی خودایە دەیکاتن ، هەڵیگرە دۆلارەکان باش هەڵگرە زێڕەکان باش هەڵگرە زیوەکان باش هەڵگرە ئەوانە هەر هەمووی فیشەکە بۆ گیانی خۆت هەڵیدەگری و دەتوانین سوێند بخۆین ئەو





دەوڵەمەندانەی کوردستان کە ئێمە دەیانناسین بە چارێگی چارێگی چارێگی نادەن و درۆ دەکەن کە هەیانە لە ڕۆژێکیدا ١٠٠ دەفتەری قازانج دەکات  بزانە خودای گەورە چیت لێدەکات لە قیامەتی ئەی دەوڵەمەند وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت : « **مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ لاَ يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحَ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ** » واتە : هەریەکێ خاوەنی زێڕ و زیوی بێت (لەو سەردەمی زیڕ و زیو مامەڵەی پێوە دەکرا ئێستاش دۆلار و دینار و دەرهەمە) حەقەکەی نەدا کە زەکاتی ماڵی خودایە ئیللا لە ڕۆژی قیامەتدا خودای رب العالمین هەمووی دەکاتە ئاسن و لەناو ئاگری جەهەندەم داغی دەکات ئەوجار دەیهێنێ شە مەلائیکەت و فریشتەکان لە لا تەنگە و تەرۆکەکانی و ( بن باڵی و گیرفانی چونکە لەوێ شتەکانی هەڵگرتووە ) پێییوە دەنێت و داغی دەکاتن پاشان چاوی داغ دەکەن ئەوجارە پشتی پێ داغ دەکەن دوای سکی پێ داغ دەکەن هەرکاتی تەواو داغی کرد و هێشاندی و زیرەی لێ هەستاند کە سارد بوویەوە دووبارە دەچن بە ئاگری جەهەندەم گەرمی دەکەنەوە و دیسان پێییوە دەنێنەوە چەندی زۆرتر بێ ئەوەندە باشتر و زیاتر داغ دەکرێت (چەند زۆرتری هەڵبگری ئەوەندە زیاتر داغ دەکرێ) کە ئەوە لە ڕۆژێکدایە کە یەک ڕۆژی ئەوکاتی بە پەنجا هەزار ساڵی دوونیا هەیە (یەک ڕۆژ داغ بکرێ حیساب بکە ٥٠ هەزار ساڵی دونیا داغ کراوی ) کە (ئەو عەذابە پێش ئەوکاتەیە خودای گەورە فەرمان دەکات مەیدانی حەشر و حیساب دەست پێبکاتن) ، (فەقیر و هەژارەکان وا نینە هیچان لەسەر نیە دەوڵەمەندەکان داغیش دەکرێن لەبەر هەندێ پێغەمبەر فەرموویەتی (ﷺ)

: « اللهم احشرنى في زمرة المساكين »[1] واتە : خودایە حەشرم بکەی لە ڕێزی فەقیر و هەژارەکان ) دەوڵەمەندەکان ماڵیان کاولە لەڕۆژی قیامەتێ مەگەر لە دوونیایێ بە هانای خۆی بێتن و پارەکەی لەگیرفان و دەستی بێت و دڵی بەخودای ببەستێتەوە و اقتدا بکات بە ابو بکر الصدیق ئەگەر ئیسلام وموسڵمانانی فەقیر و هەژار پێداویست بوون گیسک لە ماڵی خۆی بداتن و پشت ببەستی بە خودای گەورە ئەگەرنا بەخودای ئەوها نەکات زۆر زۆر زەحمەت لە مەیدانی حەشر وحیساب قیامەت قوتار و دەربازیان ببێت ، لەوێ داغ دەکرێن هەتا مەحکەمە دەست پیدەکرێت (یانی ئەگەر بەهەشتیش بن ئەو عەذابەی هەر دەدرێن) لە تەواوکەری فەرموودەکە « فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالإِبِلُ قَالَ " وَلاَ صَاحِبُ إِبِلٍ لاَ يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا فَصِيلاً وَاحِدًا تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ" . قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ قَالَ " وَلاَ صَاحِبُ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ لاَ يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلاَ جَلْحَاءُ وَلاَ عَضْبَاءُ تَنْطِحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ » واتە : کاتێ تەواو ڕێگاکە ڕوون بوویەوە یان بۆ بەهەشتە یان بۆ ناو ئاگر ، صەحابەکان ترسیان لێ نیشت و فەرموویان ئەی پێغەمبەری خودای

---

[1] اخرجه الترمذی (٢٣٥٢).

(ﷺ) ئەدی ئەوانەی حوشتریان هەیە و زەکاتی نادەن پێغەمبەر[17] (ﷺ) فەرمووی ئەوەی حووشتری هەیە و لە حووشترەکان زەکاتی نادات خودای گەورە هەموو حووشترەکان دەهێنێ لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بازنە و چەماوەیەک دەکرێ شوورەیەکە ناتوانێ هەڵبێت و ڕابکات کەسەکە هەموو وشترەکان بۆی لەناو ئەوێندەر دەکرێ و چەمووش دەکرێن و بەسەر سەر و پشت دەکەون و لە بن ئەوان دەکەوێ و لە خۆڵی وەردەدەن لەو کاتیدا تەنانەت بەچکە حووشترەکانیش وای لێدەکەن (چەند حووشتری زیارتر بێ ئەوەندە عەذابی زیاترە)جا حووشترەکان دێن لەو مەیدانەی و دەمیان دەکەنەوە هەتا هێزیان هەیە گازی لێدەدەن هەر کاتێ ئەو حووشترانەی یەکەمجار لێیان دەدا دەکشێنەوە و حووشتری دیکە دێن لێی دەدەن و بەسەری دەکەون کە ئەو عەذابە لە ڕۆژێکیە کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە بەقەدەر ڕۆژانی دوونیا تا مەحکمە و مەیدانی حەشر دەستپێدەکات وشترەکان وای لێدەکەن ئەوجا لەپاشان ئایا بەهەشتیە یان جەهەندەمی ، پاشان لە تەواوکەری فەرموودەکە : « قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْبَقَرُوَالْغَنَمُ قَالَ " وَلاَ صَاحِبُ بَقَرٍوَلاَ غَنَمٍ لاَ يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلاَ جَلْحَاءُ وَلاَ عَضْبَاءُ تَنْطِحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ " »[(١)] خەلکێکی تریش لەوێ بوون ترسیان لێ نیشت وتیان ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی ئەوانەی چێڵ و مەڕیان هەیە ؟ فەرمووی : خاوەن چێڵ و گایەکان و چاوەن مەڕ و

---

(١) اخرجة المسلم (٩٨٧) وابو داود (١٦٥٨) .

بزنەکان ئەگەر حەقەکەی نەدەن و زەکاتەکەی دەرنەکەن ئەوا شوێنێنکی بۆ هەڵدەکەنرێ و شوورەی بۆ دادەنرێ و مەلائیکەتەکان پاسەوان دەبن هیچیان نامێنێ لە چێڵ بزن و مەڕ و ماڵات ئەوەی قۆچی هەیە و ئەوەشی قۆچی نیە وە گەورە و بچووک دەهێنرێت و خودای گەورە چەمووشیان دەکات و بەرەڵا دەکرێن بۆ ناو چاڵەکە و قۆچی لێدەدەن تێی هەڵدەدەن و بە بەسمەکانیش بەسەر سەر و پشت و قاچی دەکەون کە ئەوانەی لەیەکمجار عەذابیان دەدا دەکشێنەوە و پۆلێکی دی دەست پێدەکەن لەسەر سەر و لاشەی کە ئەو عەذابە لە ڕۆژێکیە کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە بەقەدەر ڕۆژانی دوونیا پاشان خودای گەورە مەحکەمەی دەست پێدەکات و بەدیار دەکەوێت بەهەشتیە یان جەهەندەمیە .

## کۆتایی

ئەگەر لە کۆتاییدا قسەکان کوورت و پووخت بکەینەوە و ئەوەی خەڵکی پێویستی پێبت ئەوەیە کەوا زەکاتی سەرفیترە ڕای پەسەند واجبە لەسەر هەر تاکێکی موسڵمان گەورە بێ گچکە هەتا کۆرپەلەی ناو ڕەحیمی دایکی ئەگەر پێشی نوێژی جەژن لەدایک ببێت دەبێ زەکاتی سەرفیترەی بۆ بدرێت ، وە ڕای پەسەندیش لەسەر ئەوەیە کەوا لەسەر وەلی ئەمرەکەیە بیداتن هی خۆی و ئەوانەشی نەفەقەی دەکێشی و بەخێویان دەکات وە ئەگەر ویستی بۆ خەڵکی دیکەش بیداتن دەبێ مۆڵەت و ئیزن وەربگرێ بڵێ زەکاتی سەرفیترە لەجیاتی ئێوە دەدەم (ئەگەر بژێوی ژیانیان لەسەر وی نەبوو دەیویست زەکاتی سەرفیترەیان بۆ بداتن) ، لەپاشاندا زەکاتی سەرفیترە وا باشە و ڕاس ڕاجح وایە کە لە قوتی بەلەد بدرێت کە ئەو ڕایە پەسەند بوو بەلای ابن تیيميە و ابن قیيم الجوزی و وە





کۆمەڵێ لە زانایانی تر کە زۆرینیان بوون لە مەذهەبی ئیمامی مالك و مەذهەبی ئیمامی شافعی بەڵێ ئەوە ڕای پەسەند بوو کە قووتی بەلەد لەوڵاتی ئێمە برنجە وەک گوتمان هەندێکی دەڵێن دوو کیلۆ و چل غرام وە هەندێکی تر دەڵێن سێ کیلۆ بەڵام مامناوەندیەکەی دوو کیلۆ و نیو لە برنجی بدرێتن لە جیاتی هەر کەسێکی وەکو سەرفیترە ئەوەیان باشە وە باشترین کاتیش بۆ زەکات دانەکە دوای مەغریب و فتار کردنەوەی کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان ئەگەرنا ڕۆژێک و دوو ڕۆژ پێشی ڕەمەزان بێت هەتا سێ ڕۆژیش ڕێی تێ دەچێ و ئەثەرەکان بەڵگەنە لەسەری و ناشبێ دوای بخاتن بۆ دوای نوێژی جەژن ئەگەرنا بەسەر فیترە قەبوڵ نابێ و گوناهبار دەبێ و دەبێ ئیستغفار و تەوبەی بکاتن ، وەلەسەر کەسێکیشە کە خواردن و خۆراکی جەژنە و شەو و ڕۆژی جەژنەی خۆی و ئەوانەی بژێوی ژیانیان لەسەر ئەوە هەبێتن و هەندێکی زیاتر لەوی هەبێ پێویستە ئەو زەکاتی سەرفیترەی بداتن وە بیداتە فەقیرو هەژارەکان و مسکینەکان ئەوانەی نەبوونن و لەسەر بژێوی ژیانی ڕۆژانەیان قەرزار دەبنەوە کەم یان زۆر و نەیداتە هەموو صنفەکانی دی ، ئا ئەوە کورتە بووختی دەربارەی زەکاتی سەرفیترە و سەر چاکردنەوەیە (والله اعلم بالصواب). **وصل الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وَصحبه أجعين**




پڕۆژەیەکی تەواو سەربەخۆی ئیسلامیە لە پێناو بەرز ڕاگرتنی شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە دژی هەموو ڕێچکە خوار و فیکرە سەرلێشێواوەکان دەوەستێتەوە کتێبخانەی تویشوو بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بانگەوازی خوای دەکات



بە هیوای سود بینین لە بڵاو کراوەکانمان